# ڕێزمانی نۆروێژی بەشی چوارەم

# Norsk grammatikk del 4

## ناوەڕۆك

# Pronomen جێناو

## Demonstrativ جێناوی نیشانە

جێناوی نیشانە ئەو جێناوەیە کە لە جێی ناوی کەسێك یان شتێك بەکار دێت و ئاماژەی بۆ دەکات
جێناوی نیشانە لە زمانی کوردیدا بۆ کرمانجی ناوەڕاست بەم جۆرەی خوارەوەیە

**ئەمە : بۆ تاکی نێر و مێی نزیك**
**ئەوە : بۆ تاکی نێر و مێی دوور**
**ئەمانە : بۆ کۆی نێر و مێی نزیك**
**ئەوانە : بۆ کۆی نێر و مێی دوور**

**لە زمانی نۆروێژی ئەم جێناوە نیشانانەی خوارەوەمان هەن:**

**Den** **ئەوە: تاکی نێر و مێی دوور**
**Denne** **ئەمە: تاکی نێر و مێی نزیك**
**Det:** **ئەوە: تاکی نێرمۆی دوور**
**Dette:** **ئەمە: تاکی نێرمۆی نزیك**
**De :** **ئەوانە: کۆی نێر و مێی دوور**
**Disse:** **ئەمانە: کۆی نێر و مێی نزیك**

| **نزیك** | | **دوور** | |
|---|---|---|---|
| نێر: **denne** bilen | ئەم ماشێنە | **den** bilen | ئەو ماشێنە |
| مێ: **denne** veska | ئەم کیفە | **den** veska | ئەو کیفە |
| نێرمۆ: **dette** kartet | ئەم نەخشەیە | **det** kartet | ئەو نەخشەیە |
| کۆ: **disse** bilene | ئە م ماشێنانە | **de** bilene | ئەو ماشێنانە |

**هەندێ جار جێناوەکانی نیشانە لە زمانی کوردیدا شێوەی خۆیان دەگۆڕن**

# Verb کار

## Infinitiv چاوگ (مەسدەر)

چاوگ لە زمانی کوردیدا بە ژێدەر، سەرچاوە و مەسدەریش ناسراوە. چاوگ لە کوردیدا بەم جۆرە پۆلێندەکرێ

یەکەم: چاوگ لە رووی پێکهاتەوە

دووەم: نیشانەی چاوگ

سێیەم: قەدی چاوگ

چوارەم: قەدی چاوك و رەگی کار

**لە زمانی نۆرویژیدا å بەر لە چاوگ دێت، واتە بەم جۆرە:**

**å + infinitive**:

| | | |
|---|---|---|
| **for å** | بۆ ئەوەی | Anna går til kassen **for å betale** .<br>ئانا دەچێتە سەر دەخیلە بۆ ئەوەی پارە بدات |
| **å ha lyst til** | ئارەزوو لێ بوون | Hun **har lyst til å kjøpe** en norsk roman.<br>ئەوەی ئارەزووی لییە کتێبێکی رۆمان بکرێ |
| **å begynne** | دەست پێکردن | Hun **begynner å lese** i boka.<br>ئەو دەست دەکات بە خوێندنەوەی کتێبێکە |
| **å like** | حەز کردن | Hun **liker å lese**.<br>ئەو حەز دەکات بخوێنێتەوە |

## کارە یارمەتیدەرەکان بەبێ کاری سەرەکی

**لە هەندێ کاتدا دەتوانی کاری سەرەکی دوای کارە یارمەتیدەرەکان بڵێی**

| | | | |
|---|---|---|---|
| Ken **vil** (dra) hjem. | → | Ken **vil** hjem. | کێن دەیهەوێ بچێتەوە ماڵێ |
| Anna **skal** (gå) ut. | → | Anna **skal** ut. | ئانا دەڕواتە دەرێ |

وەك دەبینی لێرەدا هەم دەتوانی کاری سەرەکیش بڵێی هەم دەتوانی تەنیا کارە یارمەتیدەرەکە بڵێی

# Adjektiv هاوەڵناو

## چەند وتەیەك لەسەر هاوەڵناو لە زمانی کوردیدا

لە زمانی کوردیدا زاراوەکانی هاوەڵنا و ئاوەڵناومان هەیە، کە هەر یەك مانایان هەیە .ئاوەڵناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخاوتن کە وەسفی ناوێك یان جێناوێك دەکات، واتە دەبێتە تەواوکەری ناوێك یان جێناوێك یان ئاوەڵناوێکی تر یان تەواوکەری کارێکی تر .ئاوەڵناو دۆست و هاوڕێی ناو و جێناوە لەرستەدا

ئاوەڵناو لە زمانی کوردیدا بەم جۆرەی خوارەوە پۆلێن دەکرێ

یەکەم :ئاەڵناو لە رووی واتاوە

دووەم :ئاوەڵناو لە رووی پلەوە

سێیەم :ئاوەڵناو لە رووی پێکهاتەوە

چوارەم :ئاوەڵناو لە رووی ئەرکەوە

**ئێمە لە بەشی سێیەم باسمان لە ئاوەڵناو کرد و گوتمان زۆربەی ئاوەڵناوەکان لە زمانی نۆروێژی لە کۆتاییەکانیان پیتی t وەردەگرن، ئەگەر جێناوەکە نێرمۆ بێت و هەروەها لە کۆتاییەکانیان پیتی e وەردەگرن ئەگەر هاتوو کۆ بوو.**

**نەناسراو، ئەو کاتەی ئاوەڵناو بەر لە ناو دێت**

| تاك | | | کۆ |
|---|---|---|---|
| نێر | مێ | نێرمۆ | |
| en **brun** stol<br>کورسییەکی قاوەیی | ei **brun** seng<br>تەختەخەوێکی قاوەیی | et **brunt** bord<br>مێزێکی قاوەیی | **brune** stoler/senger/bord<br>چەند کورسی، تەختە خەو و مێزێکی قاوەیی |

### ناسراو، ئەو کاتەی ئاوەڵناو دوای ناو دێت

| تاك | | | کۆ |
|---|---|---|---|
| نێر | مێ | نێرمۆ | |
| Stolen er **brun**<br>کورسیەکە قاوەییە | Senga er **brun**<br>تەختەخەوەکە قاوەییە | Bordet er **brunt**<br>مێزەکە قاوەییە | Stolene/sengene/bordene er **brune**<br>کورسیەکان، تەختەخەوەکان و مێزەکان قاوەیین |

## شێوازەکانی دیکەی ئاوەڵناو

| | نێر | مێ | نێرمۆ | کۆ |
|---|---|---|---|---|
| 1. | en ny bil | ei ny veske | et **nytt** skjerf | nye biler |
| 2. | en billig bil | ei billig veske | et **billig** skjerf | billige biler |
| 3. | en tysk bil | ei tysk veske | et **tysk** skjerf | tyske biler |
| 4. | en praktisk bil | ei praktisk veske | et **praktisk** skjerf | praktiske biler |
| 5. | en moderne bil | ei moderne veske | et **moderne** skjerf | moderne biler |
| 6. | en grønn bil | ei grønn veske | et **grønt** skjerf | grønne biler |

| | |
|---|---|
| 1. | (**ny** - تازە). ئاوەڵناویی یەك برگەیی لە بەشی نێرمۆ لە کۆتاییەکەی **tt** وەردەگرێ |
| 2. | (**billig** - cheap). ئاوەڵناو لە بەشی نێرمۆ کە کۆتاییەکەی بە **ig** هاتبوو ئەوا **t** وەرناگرێ |
| 3. | ئاوەڵناوەکان لە بەشی نێرمۆ کاتێك باس لە نەتەوایەتیە و کۆتاییەکەی بە **sk** هاتووە ئەوا هیچکات **t**وەرناگرێ. (**tysk** - ئەڵمانی). |
| 4. | (**praktisk** – گونجاو یا راحەت). ئاوەڵناوی بێگانە کە کۆتایی بە **isk** هاتووە، ئەوا هیچکات **t** وەرناگرێت. |
| 5. | (**moderne** - مۆدێرن). ئاوەڵناوێك کە کۆتاییەکەی بە **e** هاتووە، ئەوا هیچکات لە کۆتاییەکەی **t** وەرناگرێت. |
| 6. | زۆربەی ئاوەڵناوەکان کە کۆتاییان بە دوو پیتی نەبزوێن هاتووە، ئەوا لە بەشی نێرمۆ لە کۆتایەکی **t** ی بۆ زیاد دەکەین (**grønn** - سەوز). |

## دوو ئاوەڵناوی تایبەتی

**Liten** (بچوك) og **annen** (هی تر یان یەکێکی تر) (ئەم دوانە پەیرەوی لە یاسای سەرەکی ناکەن)

### ئەو کاتەی ئاوەڵناو پێش ناو دێت

| تاك | | | کۆ |
|---|---|---|---|
| نێر | مێ | نێرمۆ | |
| en **liten** bil<br>ماشێنێکی بچوك | ei **lita** bok<br>کتێبێکی بچوك | et **lite** skjerf<br>ملپێچێکی بچوك | **små** biler/bøker/skjerf<br>چەند ماشێن، کتێب و مل پێچێکی بچوك |
| en **annen** bil<br>ماشێنێکی دیکە | ei **anna** bok<br>کتێبێکی دیکە | et **annet** skjerf<br>ملپێچێکی دیکە | **andre** biler/bøker/skjerf<br>چەند ماشێن، کتێب و ملپێچێکی دیکە |

**Liten (تاك) → små (کۆ)**

**Annen (تاك) → andre (کۆ)**

# ئەو کاتەی ناوەکە پێش ئاوەڵناو دێت

| | | | |
|---|---|---|---|
| تاك | | | کۆ |
| نێر | مێ | نێرمۆ | |
| Bilen er **liten** | Boka er **lita** | Skjerfet er **lite** | Bilene/bøkene/skjerfene er **små** |
| ماشێنەکە بچوکە | کتێبەکە بچوك | ملپێچەکە بچوکە | ماشێنەکان، کتێبەکان و ملپێچەکان بچوکن |

**Annen** (لەم بەشەدا بەکار نایەت).